# بەرەو نەوەیەکی هۆشیارتر


ناوی کتێب: گەشەپێدانی مرۆیی لەنێوان ڕواڵەت و حەقیقەتدا.

نووسینی: د. إحسان برهان الدين.

نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم، ٢٠٢٣.





**هەولێر: بازاڕی زانست بۆ کتێب و چاپەمەنی**

Website: www. nareenpub. com

nareenpub@gmail. com

**تەلەفۆن: ٢٥١١٩٨٢ ٦٦ (٠٠٩٦٤)**

**مۆبایل: ٧٥٠٤٠٦٤٦١٠ ٠٠٩٦٤**

# گەشەپێدانی مرۆیی

## لەنێوان ڕواڵەت وحەقیقەتدا

نووسینی

**د. إحسان برهان الدين**

دەزگای چاپ و پەخشی

نارین

# پێشەکی

الحمد لله والصلاة و السلام على سول الله وعلى آله و صحبه ومن والاه.

ئەم نامیلکەیە بریتییە لە وتارێکی درێژ کە لە ساڵی ٢٠١٨ لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا بڵاوم کردەوە، ئێستەش لەبەر ئەوەی لە گۆڕەپانی ئیسلامی لە کوردستاندا سەبارەت بە گەشە پێدانی مرۆیی و اقیعێکی نەخوازراو درووست بووە کە لە ئەنجامدا جۆرێك لە تێکەڵ بوونی چەمکەکانی لێ کەوتووەتەوە، بۆیە بە پێویستمان زانی ئەم جارەیان بە شێوەی نامیلکەیەك بابەتەکە بخرێتە بەردیدی خوێنەران. پێش هەموو شتێك وەکو پۆزش هێنانەوەیەك بۆ لای پەروەردگار لەسەر ئەو شێو اندنەی لە چەمکەکاندا درووست بووە و هەروەها لەبەر ئەو بۆشاییەی لەنێوان موسوڵمانان و بیروباوەڕی کیتاب و سونەتدا درووست بووە، هەروەها وەکو خزمەتێکیش بەبر ایان و خوشکانی موسوڵمانم کە لەم قۆناغە هەستیارەدا جەنگێکی ڕاگەیاندن

وفشارێکی زۆریان لەسەر هەیە بۆ ئەوەی لە ڕاستە شەقامی کیتاب و سونەت بە جۆرەها بیانوو دوور بخرێنەوە،

داواکارم لە الله تعالی ئەم نووسینە بکاتە مایەی بەرچاوڕوونی بۆ موسوڵمانان و وەکو کارێکی خێرو خزمەتێك بە دینەکەی وەریبگرێت. والحمد لله الذي بنعمته تم الصالحات.

إحسان برهان الدين

صفر١٤٤٢- ٢٢ أيلول ٢٠٢٠ /سلێمانی

## گەشەپێدانی مرۆیی لەنێوان ڕواڵەت و حەقیقەتدا

چەمکی گەشە پێدانی مرۆیی لە دوای جەنگی جیهانی دووەمەوە سەری هەڵدا، کاتێك وڵاتانی بەشداربوو لەو جەنگە – بە تایبەت وڵاتە دۆڕاوەکان – بە زیان و وێرانییەکی زۆرەوە لەو جەنگە دەرچوون، پاش ئەو کاولکارییەی بە دوای جەنگدا درووست بوو چەمکی گەشەپێدانی ئابووری سەری هەڵدا و بەدوایدا گەشەپێدانی مرۆیی بۆ جێبەجێکردنی هەندێ ئامانجی دیاریکراو.

بەڵام بە شێویەکی ڕوون و ئاشکرا ڕەگە سەرەتاییەکانی گەشە پێدانی مرۆیی لە ئەمریکاوە سەری هەڵدا و لە حەفتاکاندا بە کاریگەری هەندێ هۆکار زیاتر بڵاو بوویەوە، بە شێوەیەکی گشتی گەشە پێدانی مرۆیی بە چەند قۆناغێکدا تێپەڕبووە:

١- قۆناغی کلاسیکی دوای جەنگی جیهانی دووەم: لەم قۆناغەدا چەمکی گەشە پێدانی مرۆیی پەیوەست بوو بە لایەنی ئابوورییەوە، زانایان و بیرمەندان هەموو بایەخدانیان لەسەر

ئەوە بوو چۆن داهاتی نەتەوەیی زیاد بکەن بۆ چاککردنی ئاستی بژێوی و زیادکردنی داهاتی تاکەکان و گەیشتن بە سەربەخۆیی ئابووری.

٢- قۆناغی نێوان حەفتاکان تاکو نەوەدەکان: لەم قۆناغەدا کاریگەری ئابووری پاشەکشەی کرد و لایەنی کۆمەڵایەتی کاریگەری یەکەم و سەرەکی لەسەر گەشەپێدانی مرۆیی هەبوو، لەم قۆناغەدا کۆمەڵگەی ڕۆژئاوا لە هەموو بوارەکانی ژیاندا، پێشکەوتنی بەرچاوی بەخۆیەوە بینی، بەڵام لە ڕێگەی گەشەپێدانی مرۆییەوە نەیانتوانی خۆشبەختی و کامەرانی بۆ خەڵکی بەدەست بهێنن.

## پێناسەی گەشە پێدانی مرۆیی

گەشـــە پێدانی مرۆیی بریتییە لـە فراوان کردنی توانـاکانی فێرکردن و شــارەزایی گەلان، ئامانجیش تێیدا ئەوەیە مرۆڤ بە هەوڵەکانی بگاتە ئاستێکی بەرز لە بەرهەمهێنان و دەستکەوت و ژیـانێکی تـەنـدرووســـت و هـەروەهـا گـەشـــە پێکردنی توانـا مرۆییەکان لە ڕێگەی فەراهەم کردنی هەلی گونجاو بۆ فێرکردن وزۆرکردنی شارەزایی.

هەروەها پێناســـە دەکرێت بەوەی کە بریتییە لە زیادکردنی ئەو بژاردانەی بۆ تاکەکان لە ئارادا هەیە و ئەوەش سێ بژاردەی سەرەکی دەگرێتەوە:

– ڕەخساندنی ژیانێکی تەندرووستی درێژ و دوور لە نەخۆشی.

– پەرەپێدانی بڵاوبوونەوەی مەعریفە و زانست.

– زۆرکردنی داهاتەکان بە شـێوەیەك ژیانێکی شـایسـتە بۆ تاکەکان دەستەبەربکات.

# بوارەكانی گەشە پێدانی مرۆیی

لە بنچینەدا گەشـــەپێدانی مرۆیی زانســـتێكی ڕۆژئاوایییە و ئاوێتەیەكە لە كۆمەڵە باسـێكی گشـتی باش و بە سـوود لە گەڵ كۆمەڵە باسێكی خراپ و زیان بەخش و ناكۆك لەگەڵ ئیسلامدا كە دوا تر بۆی زیاد كراوە، بۆ نموونە لەباســە باشــەكانی كە لە ڕوانگەی ئیسلامەوە هیچ كێشـەیەكیان لەسـەرنییە ئەگەرناوو ناوەڕۆكی لـەیـەكتر جیـاواز نـەبن و لـە گـەڵ بنچینـەو بنـەمـاكانی ئیسلامدا تێك نەگیرێن:

* بەرەوپێشبردنی توا ناكان و بەهێزكردنی كەسایەتی.

* پەرەپێـدانی هونـەری گفتوگۆ وقســـە كردن و بـەهێزكردنی كەسایەتی.

* فێركردنی پەروەردەی مناڵ و بە هێزكردنی پەیوەندی خێزانی وكۆمەڵایەتی.

* پلانـدان بۆ ژیـانی ڕۆژانـە و دیـاری كردنی ئـامـانجـەكان و هونەری بەڕێوەبردنی كات وچەندین بابەتی تر.

## بۆچوونی پسپۆڕێک

بەڵام لە ڕاستیدا – وەکو دکتۆرە (فوز بنت عبد اللطيف كردي)[١] دەڵێت – گەشەپێدانی مرۆیی لەگەڵ ئەو باسانەی ئاماژەمان پێکرد، چەندین باس و لایەنی تری لە خۆگرتووە لە گەڵ ئایینی ئیسلام و بەتایبەتی لەگەڵ بیروباوەڕو تەوحیددا ناگۆنجێت وتێکدەگیرێت و بریتییە لە کۆمەڵێك نەریتی بتپەرستی و بیرۆکەی باتنی و جادووگەری و لە هەموویشی خراپتر ئەوەیە ئەم باسانە و باسەکانی تر پێکەوە گرێ دەدرێن و تێکەڵ دەکرێن و ئەستەمە بۆکەسی ناشارەزا لە بنەماکانی ئایین و بنچینەکانی عەقیدە لەیەکیان جیاکاتەوە، لەوانە:

* ئەو خولانەی تایبەتن بە (البرمجة اللغوية العصبية) بە هەموو جۆرو ڕەنگدانەوەکانی وەکو: ( هندسة نفسية، استراتيجيات العقل).

---

[١] ئافرەتێکی ئەکادیمی سعودیە، پرۆفیسۆری یاریدەدەرە لە زانکۆی جوددە، دوکتۆرای لە (العقيدة والمذاهب المعاصرة) دا هەیە، کۆمەڵێک کتێبی نووسیوە لەوانە: «حركة العصر الجديد» و«حقيقة البرمجة اللغوية العصبية» و «المذاهب الفلسفية الإلحادية الروحية».

* ئەو خولانەی کە باس لە وزەی مرۆیی (الطاقة البشـــرية) کە (الريكي والشــي كونغ) وئـەو جۆرە خوێنـدنـەوەی کـە پێی دەوترێـت (القراءة التصــويريـة) و وزەی ڕەنگـەکـان (طـاقـة الألوان) دەگرێتـەوە، لە ڕاســتیـدا هـەموو ئـەو جۆرە خولانـە پۆشـاکێکی زانسـتی لە گەشــەپێدانی مرۆیی بەبەردا دەکرێت و گەنجانی پێ لـە خشــتـەدەبرێت و لـە بنـەمـا ســـەرەکییەکانی دینەکەیان دووردەخرێنەوە بەبێ ئەوەی بە خۆیان بزانن.

بۆ نموونە شــێوازی ( القراءة التصــويرية) شــێوازێکە لە خوێنـدنەوەی فۆتۆیی بۆ کتێب لە ڕێگەی فێربوونی یاســاکانی وبەشــداریکردن لە خولی تایبەت, کەســەکە دەگاتە ئەوەی دوو لاپەڕە بە دوو چرکە بخوێنێتەوە و بەو شــێوەش بە مـاوەیەکی پێوانەیی دەبێتە خاوەن کۆمەڵێکی زۆرلە زانست و مەعریفە.

د. نجيب عبدالله الرفاعی دەڵێت لە ساڵی ١٩٩٦ لە ئەمریکا بەشـــداری خـولـێکی کـردووە تـایبەت بە فـێربوونی ئەم جۆرە خـوێـنـدنەوە کە لە لایەن داهـێـنەرەکەیەوە ( پـۆل شــیری) وتراوەتەوە، دەڵێت لە کۆتـایی دەورەکەدا ئەو شــێوازەمان لە

خوێندنەوە لەســـەر دوو کتێبی جیاواز جێبەجێ کرد، یەکێکیان باســی ڕووداوی ناخۆش و تراجیدیای تێدا بوو، ئەوی تریان بە پێچەوانەوە ڕووداوی خۆش و دڵگیری تێدا بوو، دەڵێت پاش خوێندنەوەی کتێبی یەکەم بۆ ئەوەی بزانین ناوەڕۆکی کتێبەکە باس لە چی دەکات هەستمان بە خەم و بێ تاقەتی کرد، بۆ کتێبی دووەمیش بەهەمان شێوە هەستمان بە دڵخۆشی و ئاسوودەیی کرد!

ئینجا دەڵێت من بڕیارمدا ئەو شـــێوازە لە خوێندنەوە لەســـەر قورئانی پیرۆز جێبەجێ بکەم و شـــێوازەکەشـــی ئەوەیە خوێنەر ســـەیری ناوەڕاستی هەردوو لاپەڕەکە دەکات و ئەسڵەن هەر ســـەیری خودی دوو لاپەڕەکەش ناکات کە بڕیارو ایە لە دوو چرکەدا لێیان تێبگات، دەرەنجامی خوێندنەوەی خۆی و چەند کەســـێکی تریش لە خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز بە ڕێگەی (القراءة التصـــويرية) ئەوە بووە یەکێکان لە پاش تەواوبوونی خوێندنەوەکەی لە نەخۆشی وەسوەســـە ڕزگاری بووە، یەکێکی تریان هەســـتی بە دەرچوونی بۆنێکی خۆش کردووە کە لە

موسـحەفەکە دەرچووە، ئەوی تریان هەسـتی بە ئاسـوودەیەکی زۆرکردووە، ســـەیریش ئەوەیە ئەو دکتۆرەی کە بەشـــدرای ئەو خولەی کردووەو زۆر بەو شـیٚوازە لە خوێندنەوە سـەرسـامە و دەڵێت لەو کاتەی لاپەڕەکانی موسـحەفەکە هەڵـدەدەیتەوە، سـەیری ناوەڕاستی هەردوو لاپەرەکە بکە و خۆت بخە حاڵەتێکی نزیك لە بێ ئاگایی یان وەکو کەسـێك کە داڵغە و بیر کردنەوە دەیبات وباش ئاگای لە دەوروبەری خۆی نییە، دەڵێت با چاوت بە ئەندازەیەکی کەمێك نائاسـی کر ابێتەوە و دەمیشـت کەمێك کر ابیتەوە و اتە لێوەکانت دانەخر ابن لەو کاتەدا! ئیترئەمەش بەراورد بە زۆر شـیٚوازی تر لە زانسـت و چارەسـەرەکانی گەشـەپیدانی مرۆیی ڕەنگە مەعقولی ناویان بێت، بەلام وەك دەبینی لە خەیاڵ و ئەفسـانەوە نزیکترە تاکو حەقیقەت و ڕاستی.[1]

---

[1] بڕاونە: https://youtu.be/KIzHc١WK_f٨

## ناوی گەشە پێدانی مرۆیی لە چییەوە وەرگیراوە

وادەردەکەوێت ناونانی ئەم زانستە بە ناوی گەشە پێدانی مرۆیی (التنمیة البشریة) هەڵقوڵاوی بنچینە سەرەکییەکەی بێت کە بریتییە لە: بزوتنەوەی توانا مرۆییە شاراوەکان (حرکة القدرات البشریة الکامنة) کە لە ڕۆژئاوادا سەری هەڵدا بۆ مەزن تەماشاکردنی مرۆڤ و بێ نیازو وازهێنانی لە پەروەردگار.

گەشەپێدانی مرۆیی وا پێناسە کراوە لە بنچینەدا کە بریتییە لە بەرەو پێشبردنی کەسەکان و کارکردن لەسەرخاڵە بەهێزەکانی کەسایەتییان بە مەبەستی چاککردنی ئاستی ژیانیان لە ڕووی کۆمەڵایەتی و مرۆیی و ئابووری و ئامانجیشی ئەوەیە گەشە بە توانای مرۆڤەکان بدات و بەباشترین شێوە بەکاری بهێنێت بۆ چاککردنی ژیانی تاکەکان لە ڕووی دەروونی وکۆمەڵایەتی و هەروەها بەدەستهێنانی سەرکەوتن و قازانج مادی لە ڕێگەی

چاکترکردنی شێوازی ئەنجامدانی کەسەکان بۆ کاروبارو ئەرکەکانیان.[١]

وەکو دەردەکەوێت ئەگەر حەقیقەتی پراکتیکی ئەم زانستە هاوشێوەی لایەنە تیۆرییەکەی بێت وبەتایبەتی ئەگەرئامرازو هۆکارەکانی گەیشتن بەو ئامانجانە ناشەرعی نەبن و ڕێگەی حەرامی بۆ نەگیرێتەبەر ئامانجەکانی باشن و دەکرێت موسوڵمان بتوانێت سوودی لێ وەربگرێت.

بەڵام گرفت و کێشەی گەورە ئەوەیە بابەتەکانی ئەم زانستە لەگەڵ ڕۆژگاردا بەرفراوانییەکی زۆری بەخۆیەوە بینی و هاوکات ئەو ڕێگایانەش کە بۆ ئامانجە چاکەکانیش دەگیرێنە بەر زۆر جارلەسەرهێڵێکی پێچەوانەی شەرع ڕێدەکات وئەستەمە بۆ موسوڵمانێك بیەوێت سەرپێچی شەریعەت نەکات ولەگەڵ دینەکەی خۆیدا دژوار نەبێتەوە تێیدا بەردەوام بێت.

[١] بڕوانە: ما هي التنمية البشرية؟ تعريف التنمية البشرية وأدواتها، عيد محمد.

## وریایی

ئەوەشی کە پێویستی بە وریاکردنەوە و ئاگادارکردنەوە هەیە لەم بارەوە ئەوەیە، هەندێ بانگخوازو کەسایەتی ئیسلامی هەوڵ دەدەن بەزۆر ئەو بابەتانە ببەستنەوە بە کتاب و سوننەت و گوایە بنچینە و ڕەگ وسەرچاوەیەکی ئیسلامی بۆ بدۆزنەوە، ئەوەش کارێکی زۆر خراپ و ترسناکترە لە خودی لادانەکانی ئەو بابەتانەی لە گەشەپێدانی مرۆییدا باسمان کرد، چونکە مەبەست پێی ئەوەیە لە هەنگاوێکی تێکەڵکردن و خۆڵ لە چاوکردندا ئەو فەلسەفە پووچەڵانە بە داپۆشەرێك لە بەڵگەی بەڕواڵەت ئیسلامی بشارێتەوە.

لە ڕاستیدا ئەوانەی کە سەرقاڵی شەرعاندنی بەشە ناکۆکەکانی گەشە پێدانی مرۆیین لەگەڵ عەقیدەی ئیسلامیدا کەسانێکن کە پێش هەموو شتێك لە زانستە شەرعییەکاندا زۆر لاوازن و خاوەن عەقیدەو بیروباوەڕێکی بەهێزیش نین و بەڵکو لە زۆر بابەتەکانی عەقیدەدا کوردو اتەنی سەریان تەقەی دێت و ئەوەش هۆکاری یەکەمە بۆ ئەوەی لەلادان و سەرپێچی

شەرعیدا سنورێکی دیاریکراویان نەبێت، کە بەداخەوە زۆربەی ئەوانەی خۆیان بە موسوڵمانی وابەستە بەشەرع دزانن لە گەشەپێدانی مرۆییدا لەو جۆرەن.

هەموو ئەوانەش کە سەرقاڵی ئەم پرسەن پێویستە ئەوە بزانن کە ناوی ڕەسەنی ئەم زانستە لە بنچینەدا بریتییە لە: (حركة القدرات البشرية الكامنة) یە و لە بنچینەشدا بۆ ئەوە داهێنراوە کە مرۆڤ ئەوەندە بەهێزببێت کە چیدی پێویستی بە الله وبە پەرستراو نەبێت وداوای هیچی لێ نەکات وپشت بەخۆی ببەستێت، ئەمەش بێگومان ڕەنگدانەوەی زۆری هەیە لەسەر ئەو خولانەی بۆ بەهێزکردنی تاکەکان دەوترێتەوە و ئەگەرچی بە ڕاشکاویش ئەو ئامانجە ناخەنە ڕوو، بەڵام دواجار بەرنامەیەکی ڕوون و ئاشکرایە.[١]

[١] بڕوانە: علم التنمية البشرية في منظار الشرع، إسلام ويب.

## گەشەپێدانی مرۆیی بانگەشەو واقیعی جیاوازە

ئەگەر بێت وخولەکانی گەشـــە پیدانی مرۆیی لە بازنەی باســـەکانی چۆنییەتی زاڵبوون بەســـەرخەمۆکی و شـــێوازەکانی بەڕێوەبردن و ســـوود وەرگرتن لە کات و ئەو جۆرە باســـانەدا بمایەتەوە، زانایان و بیرمەندە دڵســـۆزەکانی ئیســـلام زەنگی ترســـناکییان لەم زانســـتە هەرگیز لێ نەدەدا، ئەمڕۆ گەشـــە پێدانی مرۆیی بووەتە بواروبازنەیەك جۆرەها تاوان و ســـەرپێچی گەورە لە خۆ دەگرێت، وای لێ هاتووە ئاســـاییە و جێگای سەرسوڕمان نییە لە باسەکانی ئەوزانستەدا:

– شیرکی گەورە و بچووك و جادوو و جۆرەها بیدعەو ئەفسانە و فەلسەفەی دژبە ئیسلامت بەرچاو بکەوێت.

– جۆرەها چارەســـەروعیلاجی بێ بنەما و دوور لە ڕاســـتی تێدایە زیاترنییە لە قۆســـتنەوەی بێ کاری و بێزاری ئەوهەموو گەنجە و وەرگرتنی پارە و ماڵی خەڵکی بە بێ پاساوێکی مەنتیقی.

– قســـەو بیرۆکەی ناکۆکی زۆر تێدا بەدی دەکرێت کە لەگەڵ عەقیدەی تەوحیددا یەك ناگرێتەوەو ناکۆکە، لە خراپترینیان

ئەوەیە ئەم زانســـتە کار لـە ســـەر مرۆڤەکان دەکات، بەو واتـایـەی لـە هـەموو شـــتێـك بێ منەت و بێ نیـاز بێـت بـە پەروەرگاریشیەوە.

– گەشـــە پێدانی مرۆیی لە هەندێ باســـی بەســـوودەوە کە سـەرەتاکەی بەوە دەستی پێکردووە، ئێستا بووەتە بازرگانییەکی پەتی و بووە بە تەڵەیەك بۆ ڕاوکردنی گەنجان و خەڵکانێك کە بەدەســـتی نەخۆشـــی و دڵەڕاوکێ و کێشـــەی خێزانی ولاوازی کەســـایەتییەوە دەناڵێنن وگیرفانیان بەتاڵ دەکەن و بەســـەر ئەوانەوە خۆیان دەوڵەمەند دەکەن.

– لە ســـایەی دابەزینی ئاســـتی زانســـتی گەنجان بەتایبەت و خەڵکی بە شـــێوەیەکی گشـــتی ســـەرەڕای زۆری بڕوانەمەکان، ڕاهینەران و ســـەرپەشـــتیارانی گەشـــە پێدانی مرۆیی گۆڕەپانیان بۆ چۆڵ بووە و لە ڕێگەی هەندێ لەوانەی بە فرۆشیارانی وەهم (باعة الوهم) وەسف دەکرێن ودەناسرێن، زۆرزانیاری ناڕاست و چارەســـەری بێ بنەما و ئاڕاســـتە کردنی ئەفســـانەیی بۆ خەڵکی ئەنجام دەدەن.

– گەشــە پێدانی مرۆیی بووەتە هۆکارێك بۆ لاوازی ئیمان و ســەرپێچی بیروباوەڕەکانی ئیســلام لـەڕێگـەی بڵاوکردنـەوەی چەمکی پشــت بەســتنی تاك بە خۆی لە هەموو شــتێکدا بە ڕەهایی و لابردن و پشــت گویێ خســتنی باوەڕو (توکل) و پشــت بەسـتن بە الله تعالی، لە گەشــەپێدانی مرۆییدا هەرگیز جیگەی ئەوەی تێدا نابێتەوە بەشــداربووان فێری ئەوە بکرێن پشــت بە پەروەردگاریان ببەستن و ئومێدیان پێی بێیت،

بەڵکو بەردەوام فێری ئەوە دەکرێن پشت بەتو اناکانی خۆیان ببەســتن و ئومێدیان بەخۆیان بێت بۆ جێبەجێکردنی هەموو ئامانجەکانیان.

– زۆر جار خول دەکرێتەوە بۆ هەندێ بابەت کە مەترســی ئەوەی هەیە موســوڵمان لە بازنەی ئیســلام بباتە دەروە، ئەو چارەسەرانەی ئەوان وەسفی دەکەن هەمووی دوورە لەوەی لە قورئان و لە سـوننەتدا هاتووە و زۆر جار باسی داهاتوو و غەیب و چۆنیەتی زانینی داهاتووی کەســەکە لەڕێگەی ئیمزا وخەتی ئەو کەسە و چارەسەرکردن بەوەی

پێی دەڵێن:( العلاج بالاحجار الكريمة) وەکو مرواری و بەردە بەنرخەکانی تر.

لێرەدا تێبینییەکی گرنگ هەیە پێویستە باس بکرێت ئەویش ئەوەیە لەم ساڵانەی دواییدا زۆر بیردۆزەو ڕێورەسمی لادینی و وەسەنی لەژێر بەهانەی گەشەپێدانی مرۆییدا تێدەپەڕێنرێت وزۆرێك لە گەنجەکانیش لە ژێر زۆر ناوی ساختە کە ڕواڵەتی لە حەقیقەتی جیاوازە وەکو ( هندسة نفسية، استراتيجيات العقل ) فریویان خواردووە وتێکەوتوون بی ئەوەی بەخۆیان بزانن.

## چارەسەرکردن بە وزە

وەکو وتمان یەکێك لە ترسناکترین بانگەشەکانیان مەسەلەی چارەسەرکردنە بە وزە و زۆریش هەوڵ دەدەن پۆشاکێکی زانستی بەبەردا بکەن و لە بنچینە بتپەرستییەکەی دووری بخەنەوە بۆ ئەوەی ببێتە مەسەلەیەکی زانستی ئاسایی، لە کاتێکدا خۆی وا نییە؛ لە ڕاستیدا بیرۆکەی چارەسەرکردن بە وزە ( العلاج بالطاقة) بەتەواوی لە مەجوسە ئاگر پەرستەکانەوە وەرگیراوە، کە بەلای ئەوانەوە یەزدان خودای ڕوناکییە و ئەهریمەن خودای تاریکییە و ئەوان باوەڕیان وایە ڕووناکی و تاریکی دوو بنەمای دژە یەکترن و سەرەتای بوونەوەرن و ئەڵین هەموو پێکهاتەکان لە ئاوێتەبوونی ئەو دووانە درووست بووە، بۆیە دەبینی باسی ڕووناکی و تاریکی و (یەن و یانگ) و ڕاکێشان و لەرینەوەی ئەرێنی و نەرێنی دەکەن، باسەکەش قسە زۆر هەڵدەگرێت بەڵام من لێرەدا تەنها مەبەستم ئاماژە پێکردنە، یەکێکیش لەو تەڵەکەبازودەجالانەی ئەو بیرۆکە بڵاو دەکەنەوە و کاری لەسەر دەکەن (عدنان اوکتان) ە.

هەنـدێـك لە موســوڵمـانـانیش یـان بە هۆکـاری جەهـل و نەزانین، یان نیازخراپی، پاســاو بۆباســەکانی وزە دەهێننەوە و دەڵێن مەبەست لە

واتای بەرەکەتە کە لە ئیسلامدا بوونی هەیە، یان مەبەست پێی وزەی فیزیکییە و جیـاوازە لەو وزە شــیرکییەی کە بـاس دەکرێت لە گەشــەپێدانی مرۆییدا! دەڵێن چـارەســەر بەوزە بریتییە لە گەیاندنی ئەو وزەی کە لە گەردوندا الله درووســتی کـردووە بە جەســتەی نەخۆشــەکە، ئەمەش زیـاتر نییە لە پەردەپۆشکردنێك بۆ ئەو بیروباوەڕە بتپەرستییە.

فەلسەفەی وزە پەیوەندی بە ئایینە ڕۆژهەڵاتییەکانەوە هەیە کە لە چین و سنغافۆرە و مالیزیا بوونیان هەیە وبەربڵاون.

## البرمجة اللغوية العصبية

بە هەمان شێوە مەسەلەی (البرمجة اللغوية العصبية) کە کۆمەڵێك ڕێگەو شـێوازە پشـت بە هەندێك بنەمای دەروونی دەبەسـتێت بۆ چارەسـەرکردنی کێشـەی دەروونی، بە هەموو جۆرە جیاوازەکانیشـیەوە ئاویتەیەکە لە کەش و هەوای بت پەرستن و فەلسەفەکانی ڕۆژهەڵاتی چینی و هیندی، کە ئەمەش لە ڕاسـتیدا یەکێکە لە زۆرترین ئەو بابەتانەی ڕاهێنەرەکانی گەشـە پێدانی مرۆیی کاری لەسـەردەکەن، بابەتێکی تەواو ناکۆکە لە گەڵ بیروباوەڕی ئیسلامدا و بەڵکو– لە ئاستێك لە ئاستەکانیدا – جۆرێکە لە دەرکردنی موسـوڵمان لە بازنەی دینەکەی، چونکە کار لەسـەر لابردنی هەموو بیروباوەڕو تێگەیشتن و چەمکە فیکرییەکانی دەکات و کۆمەڵێك بیروباوەڕو چەمکی فیکری نوێیان لە جێگەدا دادەنێت، ئەم پرۆگرامسازییە بە کورتی: بریتییە لە هەڵوەشاندنەوەی بیروباوەڕەکانی مرۆڤ و وردە وردە لابردن و لەناوبردنی و گۆڕینی بە کۆمەڵێك بیروباوەڕی تری جیاواز– کە ئەوان دەڵێن یارمەتیدەرو دەستەبەرکەری

ســـەرکەوتنە – ئیتر ئایا ئەو بیرروباوەڕە نوێیانە ئایینی بن یان شـــتی تر، بەڵام بەهەرحاڵ هەرچییەك بێت قال الله و قال الرسول ی تێدا جێ نابێتەوە و هیچ بایەخێکی پێ نادرێت.

بەڵکو ئەو پرۆگرامســـازییە کە وەکو فۆرمات کردنێکە بۆ ســـەرجەم زانیارییەکانی ڕابووردووی ئەو کەســـە، جێگای داخیشـە کە (ابراهیم الفقي)[١] بە شـێوەیەك لە شـێوەکان لەم بوارە کاری دەکرد و هەندێکیش بەیەکەم کەســی دەزانن کە ئەوم پرۆگرامسازییەی هیناوەتە ناو دەوڵەتە عەرەبییەکانەوە.

بێگومان ئەم بابەتە کە بریتییە لە ئەندازیاری دەروونناســی وەکو هەندێك جاردەربڕینی لێ دەکەن ، بە هەموو شـــێوەیەك مەسەلەی باوەڕبوون بە قەدەرکە ڕوکن و کۆڵەکەی شەشەمی

[١]لە سـاڵی ١٩٥٠ لە دایک بووە و لە سـاڵی ٢٠١٢ لە ڕوداویکی ئاگرکەوتنەوە لە میســـر وەفاتی کردووە، شـــارەزایەکی بەناوبانگ بوو لە بواری گەشـــە پێدانی مرۆیی و البرمجة العصـــبية دا، چەندین زمانی دەزانی و ڕاهینەرێکی نیودەوڵەتی بوو کە هەزاران کەس ئامادەی خولەکانی دەبوون، زۆربەی ئەو ســەرپێچییانەی لە گەشــەپێدانی مرۆییدا هەیە لەگەڵ عەقیدەی ئیســلامیدا ئەو دەســـتی بووە لەپەرەپێدان و فێرکردنی خەڵکیدا. خاوەنی کۆمەڵێکی زۆرە لە کتێب و وانە و محاضرات.

ئیمـانە فەرامۆش دەکات، چونکە هەمیشـــە ڕێگای گەرەنتی و سەد لە سەد بۆ سەرکەوتن وەسف دەکات.

بۆیە کۆمەڵێك لە زانـاو پســـپۆڕانی موســـوڵمـان لە بواری عەقیدە وعلم النفس و الطب النفسـي وئاییناناسـیدا وریاییان لەمەی پێی دەوترێت ( البرمجة اللغوية العصـبية) و سـەبارەت بە مەترسی وزیانەکانە داوەو وتوویانە:

١- ئەم زانستە ڕەگ و ڕیشەی فەلسەفی و عەقیدەیی دوور لە ئیسلامی هەیە.

٢- ئەم جۆرە پرۆگرامســازییەی باس دەکرێت شـــۆردنەوە بۆ مێشــکی کەســی موســـوڵمان دەکات و هەندێ بیرۆکەی نامۆ و تێکگیراو لە گەڵ عەقیدەی ئیســـلام لەلای دەچەســـپێنێت،کە پوختەکەی ئەوەیە: بوونەوەر یەك بوونەوەرە، نە پەروەردگار و نە بەندە، نە درووستکەر و نە درووستکراو بوونیان نییە، بەڵکو هەمووی بریتیە لە تەنها یەك هەبوون، بەمەش دەچنەوە سـەر عەقیدەی (وحدة الوجود) ی ئیبنو عەرەبی و گومڕاکانی تر.

٣- ئەم زانستە ئەگەرچی هەندێ جار دەرەنجامی ڕاست بە دەستەوە دەدات، بەڵام پشت بە هەندێك هۆکاری وەهمی و خەیاڵاوی دەبەستێت، بۆیە بە هەموو شێوەیەك حەرامە مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت.

٤- ئەم زانستە کە پێی دەوترێت: (علم البرمجة اللغوية العصبية) مەترسییەکەی دیارو ئاشکرایە، بۆیە پێویستە موسوڵمانان لە مەترسییەکانی وریا بکرێنەوە.

## باسەکانی سەرکەوتن

باسی سەرکەوتنیش یەکێکە لەو باسانەی ملیونەها خەڵکیان پێ گێل کردووە و پارەکانیان بەناحەق لێ وەردەگرن، ئەوان دەڵێن گوایە یارمەتی خەڵکی دەدەن بۆ سەرکەوتن، بێگومان سەرکەوتن لە هەموو بوارێکدا، ئیتر گرنگ نییە ئەو کەسە بازرگانی مادە هۆشبەرەکان بکات یان هەر بازرگانی و کارێك کە بنەمای ڕەوشتی و ئایینی تێدا نەبێت، گرنگ ئەوەیە ئەوان فێری سەرکەوتنی دەکەن!

ئینجا هەمیشە ئەوان سەرانی بێ باوەڕانی دونیا دەکەنە پێشەنگ و هێما و دەیانەوێت لاسایی بکرێنەوە و بکرێنە پێشەنگ و وەکو کەسانی نموونەیی تەماشا بکرێن، هەمیشە کەسانێك کە بە دەقی قورئان و سوننەت لە دۆزەخدان و تۆ دەبێت لە پێناو سەرکەوتندا بیانکەیتە پێشەنگ و پێشەوای خۆت.

چەمکی سەرکەوتن لەلای ئەوان تەنها گەیشتنە بە ئامانجی مادی وبەدەستهێنانی پارەیە، هەر بۆیە زۆربەی ئەوڕاهێنەرانە

بەردەوام خەریکی پارە کۆکردنەوەن لەو کەسانەی بەدوای سەرکەوتندا وێڵن، لە کاتێکدا خۆیشیان نازانن لەچیدا دەیانەوێت سەربکەون.

## بانگەشەی زانینی ئاینده (علم الغيب)

زۆرجارلە خولەکانی گەشەپێدانی مرۆییدا بەمەبەست بێت یان بە شێوازێکی هەڕەمەکی، وشەگەلێك بەکاردەهێنن تەنها بۆ زاتی الله دەگونجێت بەکاربێت، لە کاتێکدا ئەوان بۆئەوخەڵکە داماوە بەکاری دەهێنن کە کەوتوونەتە داوی ڕاهینەرانی ئەو زانستە و ئەوانیش وەکو هەلێکی زێڕین بۆ دەوڵەمەند کردنی خۆیان مامەڵەیان لەگەڵدا دەکەن.

ئەوان بۆ نموونە بەو خەڵکە دەڵێن: ئێوە وزەی ڕەهاو بێ سنوور(طاقات مطلقة) تان تێدایە و دەبێت بیدۆزنەوە! ئەو وەسفەش تەنها بۆالله کە خاوەنی توانای ڕەها وبێ سنوورە شیاوە بەکاردبێت و بۆکەسی ترناشێت بەکاربهێنرێت، بەو شێوەش بنەمای پێویست بوونی بەندەکان ونیازو ئاتاجییان بۆ پەروەردگاریان لاوازدەکەن و کار لەسەرلاوازکردنی ئیمانی کەسەکان دەکەن.

یان لە ڕێگەی دەستخەت و ئیمزا و ئەوجۆرە شتانەوە باسی ئایینده و داهاتووی بۆدەکەن و بە کورتی ئەوشتانەی ئەوان

بانگەشـــەی زانینی دەکەن لە تایبەتمەندییەکانی تەنها الله یە و بەندە ئەگەر باوەڕی پێ بێت لە بازنەی ئیسلام دەردەچێت.

هەروەها شـــیکاری کردن بۆ کەســـایەتییەکان بە پێی پیتی یەکەمی ناوی کەسەکە و ڕەنگ و ئاژەڵی دڵخوازی ئەو کەسە – وەکو یەکێك لە پســـپۆڕانی ئەم بوارە دەڵێت – جیاوازییەکی زۆری نییە لە کتێبگرتنەوەو فاڵ و ســـەیرکردنی بورجەکان، چونکە هەموو ئەمانە لەســـەر هەندێ پەیوەندی فەلســـەفی و گوایە نهێنی وەرگیراو دادەمەزرێت کە لە کتێبە ئایینییە وەسەنییەکانی ڕۆژهەڵاتەوە سەرچاوە دەگرێت کە تێیدا باسی تایبەتمەندی پیتەکان کراوە و کێ ناوی بەچ پیتێك دەســـت پێ بکات یان ئارەزووی چ ڕەنگێکی هەبێت کەســـایەتییەکی گوایە بەو شێوە و بەو تایبەتمەندییە دەبێت.

هەر وەکو رەنگدانەوەیەکیش بۆ ئەو زانیاریانەی لەو کتێبانەی ئاماژەمان پیکرد هاتووە، دەبینین هەندی لە ڕاهێنەران باسی چارەسەرکردن دەکەن بە بەکارهێنانی نهێنییەکانی ناوەکانی الله تعالى (الأســـماء الحســـنى)، هەروەها

باسی وزەش هاتە کایە کە وزە بنچینەی هەموو شتێکە وهەموو شــتێـك وزەیەکی هەیە ئەگەر فێری بین ڕێگـاکـانی ســـوود لی وەرگـرتـنـیـمـان بـۆ دەکـرێـتەوە وزۆر بـاس و بـابەتی تـر کە بە شــێوەیەکی قـۆنـاغ بە قـۆنـاغ بەشــداربوو انی ئەو جـۆرە خـولانەی گەشـەپێدانی مرۆیی بەرەو سـەرپێچی کردنی بنەماکانی عەقیدەو تەوحید دەبات.

## العقل الواعي و العقل اللاواعي

بە هەمان شـێوە ئەو باسـانەی کە پەیوەندی بە (العقل الواعي) و (العقل اللاواعي) هەیە بیرۆکەی ناکۆکە لە گەڵ تەوحید و ئیمان بە بنەماکانی ئیسـلام و جۆرێکە لە ڕەواجدان بە فەلسەفە گومڕاکانی سەدە ڕابووردووەکان.

و اتای ڕواڵەتی ئەم بەشـەی گەشـە پێدانی مرۆیی لە دیدی خۆیانەوە بریتییە لە پەی بردن و بە جیهانی ناوەوەی مرۆڤەکان و دەرخستنی تو انا شاراوەکانیان و دواجار پەی بردن بە شێوازی بیرکردنەوە و جۆری کەسـایەتی کەسـەکە و ناسـینی ئەو تەگەر انەی لە ڕیگەی سەرکەوتنیدا دەوەستێت!

ئەوەش هەرلەم میانەدا بە ( العقل الباطن) باسـی دەکەن لە ڕاسـتیدا ئەوان وەکو پەرسـتراوێك باسی دەکەن کە ڕۆزی و شـیفا و چارەسـەرو سـەلامەتی هەمووی لای ئەوە، بەوەش دوورکەوتنەوەی تەواو لە گەڵ عەقیدەی تەوحیددا درووسـت دەبێت.

سەرەتاکانی ئەم باسانەش لە نووسینەکانی فەیلەسووفە بەناو ئیسلامییەکاندا هاتووە وەکو الفارابي و ابن سینا کە ئەو جۆرە زانیارییانە بۆ شتێك دەگێڕنەوە کە بە (العقل الفعال ) ناوی دەبەن کاتێك دەڵێن عەقڵی مرۆڤەکان لە ڕێگەی گەشەکردنیدا بەچەند قۆناغێکدا تیدەپەڕێت و باسی قۆناغی بەهێزبوون و پاش بەدەستهێنانی بڕێکی زۆر لە زانیاری دەگاتە ئاستی عەقڵی کردار و دوای ئەو قۆناغە کاتێك زانیاری و مەعریفەی کەسەکە فراوان دەبێتەوە و شارەزایی دەربارەی زۆربەی شتەکان بەدەست دەهێنێت ئیتر دەگاتە ئاستێکی زۆر پێشکەوتوو کە بە (العقل المستفاد) یان (الفيض والإلهام) ناوی دەبەن کە لەو قۆناغەدا مرۆڤ دەگاتە ئەوپەڕی پلەکانی بەختەوەری وهەر لەم ڕێگە و باسانەشەوە بیرۆکەی (الحلول والاتحاد) لەلای سۆفییەکان سەریهەڵدا لەسەردەمانی دێریندا و تاکو ئێستەش ئەو بیرۆکە هەرماوە وشوێنکەوتووی خۆی هەیە کە لەگەل بیروباوەری قورئان و سوننەتدا راستەوخۆ تیکدەگیرێت، چونکە ئەو باسانەی ئەوان لە ژێر ناونیشانی

فیض و إلهام و ناونیشانی تردا دەیانکرد، هەمان ئەو باسانەیە کە ئەمرۆ بەناوی (الوعي و اللاوعي) و (العقل الباطن) و ئەو جۆرە باسانەوە دەکرێت، بێگومان لەگەڵ هەندێ هەموارکردنەوەو دەستکاری کە سروشتی سەردەم دەیخوازێت.

لەڕاستیدا ئەم بابەتە زۆر بابەتێکی هەستیار و ورد وپڕ لە مەترسییە بۆ ئیمانی کەسەکان، بە چڕیش لەگەڵ بیروباوەڕی ئیسلامیدا تێکدەگیرێت و ئامۆژگاری خوێنەرانی بەڕێز دەکەم کە نوسینەکانی (د.فوز بنت عبد اللطیف كردي) بخوێننەوە بە تایبەتی تێزی دوکتۆراکەی بەناونیشانی: (أصول الإيمان بالغيب و آثاره)، هەروەها کتێبەکانی: (المذاهب الفلسفية الإلحادية الروحية وتطبيقاتها) و کتێبی: (الأصول الدينية لتطبيقات الاستشفاء والرياضة الو افدة من الشرق عبر الغرب وخطورتها على معتقد الأمة) چونکە زۆر جەخت لەسەر تێکگیرانەکانی ئەو بابەتانە لە گەڵ عەقیدەی ئیسلامیدا دەکاتەوە.

## چارەسە بە ڕێگەی ناشەرعی

هەندێك لە خولەكانی گەشەپێدانی مرۆیی ڕاستەوخۆ لەگەڵ عەقیدەو بیروباوەڕی تەوحیددا كە بنەمای موسوڵمانێتی هەموو موسوڵمانێكە تێكدەگیرێت و پێچەوانەیە.

بۆ نموونە چارەسەركردن بە كریستاڵ و گەوهەری شەوچراو مرواری وئەو جۆرە شتانە، هەروەها ئەو دەستەوانەی كە لە دەستی هەندێ لە بەشداربووانی خولەكانیانی دەكەن و چەندین ڕەفتاری تریان لە كاتی بەراورد كردنیان لەگەڵ شەرعی ئیسلامدا دەبینین لەئەوپەڕی جیاوازی و لەیەكترازاندایە.

یەكێكیش لە شێوازەكانی چارەسەركردن كە لە بەشێك لەبەشەكانی گەشە پێدانی مرۆییدا بەكاردێت مەسەلەی چارەسەركردنە بۆوەی كە بە (بلورات الشفاء) دەناسرێت كە لە ڕێگەی بەردی مرواری و شیلان و گەوهەری شەوچراووئەو جۆرە شتانەوە چارەسەی نەخۆشی دەروونی و ەستەیی پێ بكرێت، چونكە باوەریان وایە ئەو بەرد و گەوهەرانە توانایەكی

بەهێزی شاراوەیان تێدایە کە هێزبە لاشـە و خۆشی بە دەروونی مرۆڤەکان دەبەخشـێت. کە لە ڕاسـتیدا ئەوڕێگەچارانە نە لە ڕێگەی شەرع و نە لە هیچ ڕێگەیەکی ترەوە نەسەلماوە کە وابێت، بە پێچەوانەشـەوە ئەو پرسـە دەچێتە بواری بابەتێکی مەترسیداری عەقیدەوە لە ئیسلامدا کە ئەویش مەسـەلەی نوشتەو چاوەزارە کە بەتوندی لە فەرموودکاندا قەدەغە کراوە، وەکو لە فەرموودەی صـحـحی دا هاتووە: ( مَنْ تَعَلَّقَ تَمِيمَةً فَلا أَتَمَّ اللَّهُ لَهُ وَمَنْ تَعَلَّقَ وَدَعَةً فَلا وَدَعَ اللَّهُ لَهُ )[1] بۆیە وەکو زانایان دەفەرموون هەر جۆرە متمانەیەك بەو حەڵقەی کە لە پەنجە دەکرێت یان بە یەکێك لەو شـتانەی باسـمان کرد حوکمەکەی بەدەر نییە لەوەی شـیرکی گەورە بێت ئەگەر باوەری وابێت ئەو شـتە خۆی بۆ خۆی چارەسـەردەکات یان شـیرکی بچووك بیت ئەگەر باوەڕی وابێت هۆکارێکە چونکە بە هیچ بەڵگەیەك ئەوانە نابنە هۆکار.[2]

---

[1] أحمد (١٧٤٤٠) وحسنه الأرنؤوط.

[2] بڕوانە: " مجموع فتاوى ورسائل العثيمين " (٩ / ١٥٥) .

## گاڵتە کردن بە عەقڵی خەڵکی

هەروەها زۆر جار خولەکانی گەشە پێدانی مرۆیی تەنها خەیاڵ فرۆشتن و گاڵتە کردنە بە عەقڵی خەڵکی و قۆستنەوەیە بۆ مەسەلەی هەژاری و بێکاری ئەوان لە ئاراستەیەکدا کە لەبەرژەوەندی مادی ئەو کەسانە تەواو دەبێت کە ئەو خولانە دەکەنەوە، لە خولی وا هەبووە بەو خەڵکەیان وتووە چاو بنووقێنن و بیست جار بڵێن دەوڵەمەند دەبم دەوڵەمەند دەبم، بۆ ئەوەی دەولەمەند بن!

یان بە کەسێکی شکست خواردووولاواز ئەڵێن: بۆ چەندین جاری زۆر لەگەڵ خۆتدا ئەوە دووبارە بکەرەوە بڵێ: من بە هێزم من سەرکەوتووم بۆ ئەوەی قەناعەتی بۆ درووست ببێت کە بە هێزەو سەرکەوتووە!

ئەمە جگە لەوەی کە بەبێ ڕەچاوکردنی ڕێزو کەرامەتی ئەوان زۆر جار بە شێوەیەکی بە کۆمەڵ هەڵیاندەسێنن و دایان دەنیشێنن و هەندێ قسەیان پێ دەڵێنەوە و هەندێ دەستەواژەیان پێ دووپات دەکەنەوە بە دەنگی بەرز، وەکو

ڕۆبۆت مامەڵەیان لەگەڵدا دەکەن و ئەوانیش لەبەرئەوفەراغ وداماوییەی تێییدان بە قسەیان دەکەن.

ســـاڵان دێت و دەڕوات ڕاهێنـەران بـە پـارەی خـەڵکی دامـاو دەوڵـەمـەنـد دەبن و ئـەوانیش لـە هـەمـان هـەژاری و نـەداری و بێکاری و شکست خواردوویی خۆیاندا دەمێننەوە.

یـان جـاری واهـەیە بە ئـامـادەبووان دەڵێن: بـە پـەنجـەیـەکت لایەکی لووتت دابخە و بەولایەکەی تری بۆ ماوەیەك هەناســـە هەڵمژە، ئینجا ئەولاکەی تری لووتت دابخە و لەوبەشـــەکەی ترەوە هەناســـە دەربکە، گوایە ئەمە فشـــار لەســـەر کەســـەکە کەم دەکاتەوە، یان بە قووڵی هەناســـە هەڵمژین وای نیشـــان دەدەن زۆرکێشـــەی دەروونی وگرفتی ترچارەســـەردەکات. بە کورتی:

کۆمەڵێکی زۆر ڕێوشـــوێنی نـازانســـتی و بێ بەڵگە و زۆرجـار تێکگیراولەگەڵ شـــەریعەتدا بەکاردەهێنن (مَا أَنْزَلَ اللَّهُ بِهَا مِنْ سُلْطَانٍ).

## مایکرۆبایۆتیک

یەکێکی تر لەو بابەتە ترسناکانەی کە تێکەڵ بە گەشە پێدانی مرۆیی کراوە وبە ڕواڵەت تەنها سیستمێکە بۆ پارێز لە مەسەلەی خواردن و لە ڕاستیشدا بانگەشەیەکە بۆزیندوو کردنەوەی چەندین فەلسەفەو بنەمای دژ بە عەقیدەی ئیسلامی کە لە ئاینەکانی تاوی و بوزی و هیندۆسی وەرگیراون، ئەوەش بریتییە لە مایکرۆبایۆتیك، ئەم زاراوەیە و اتای ژیانی مەزن یان تێڕو انینی مەزن بۆ ژیان دەگرێتەوە و یەکەمین کەس بانگەشەی بۆکرد لە چلەکانی سەدەی رابوردوو (ئۆساوا)[1] ی یابانی بوو.

لەم سیستمەدا داوا لەو کەسانە دەکرێت کە دەیانەوێت لە وزەی گەردوونی سوودمەند بن، لە خواردنی گۆشتی سوور

[1] جۆرج ئۆساوا، دامەزرێنەری سیستمی خۆراکی مایکرۆبایۆتیک، لە دیکبووی ١٨٨٣ میلادی، زیاتر لە ٣٠٠ کتێبی نووسیوە و تەندروستی لەسەر بنەمای حەوت پێوەر دیاری دەکرد: کەمیی ماندووبوون، هەبوونی حەزی خوارد بە شێوەیەکی باش، خەوتنی باش، بیرگەو بیرەوەری باش، گاڵتەکردن و قسەخۆشی، وردی لە بیرکردنەوەو کرداردا، سوپاس کردنی خەڵکی وپێزانین بەرانبەر کارەکانیان.

خۆیان بە دوور بگرن و خواردنە ڕووەکییەکان بخۆن بۆ ئەوەی بتوانن لەو وزە گەردوونییە بەهرەمەند بن و تەمەنێکی درێژو تەندرووستی و پاراوی و کامەرانی ومێشك سافییان بەدەست بکەوێت، ئەم تیۆرەی (ئۆساوا) کە هەوڵ دەدرێت پۆشاکێکی ئیسلامیشی بەربەردا بکرێت و ڕەگ و ڕیشەی ئایینی بۆ بدۆزرێتەوە، لەلایەن هەندێکەوە بانگەشەیەکی ڕوون و ئاشکرایە بۆ ئایینە بتپەرستییە ڕۆژهەڵاتییەکان و هەندێ ڕێرەوەی ئیلحادی ڕۆژئاوایی و ئەمرۆ ڕاهێنەران ئەو پەڕی ئاواتیان ئەوەیە بگەنە ئەوەی بتوانن بەو ڕێگەیە چارەسەری بەشداربووانی خولەکانیان بکەن، لەگەڵ دەستکەوتە دارایییەکانیان بەسەر خەڵکی ڕەش و ڕووت و دینی خۆیان و ئەوانیش تووشی لەدەستدان و هیچ نەبێت مەترسی زۆر دەکەن.

بۆزانینی حەقیقەتی ئەم باسە و باسەکانی چارەسەربە وزەی گەردوون بگەڕێنەوە بۆ وانەکانی شێخ محمد صالح

المنجد و دکتۆرە فوزعبداللطیف کردی، نووســین و وانەی زۆر بە سوود و زانستیان لە ماڵپەڕەکانی خۆیان لەو بارەوە هەیە.

## چارەسەر کردن بەبەرد و کریستاڵ

هەرلەم بارەوە مەسەلەیەکی تری زۆرگرنگ و ترسناك هەیە ئەویش مەسەلەی چارەسەرکردنە بە بەرد وکریستاڵ و مرواری و ئەقیق شیلان و گوهەری شەوچرا وئەو جۆرە شتانە.

ئەوڕاهێنەرانە هەڵدەستن بە دیاری کردنی بەردی گونجاو بۆ کەسەکە بەپێی پرۆگرامسازی بورجەکەی و ڕۆژی لە دایکبوونی و ڕەنگی خەرمانەی وزەکەی، دوای ئەوە پێویستە چارەسەرخوازەکە ئەو بەردە یان ئەو بازنگە بەخۆیەوە هەڵواسێت، یان بخرێتە ناوئاوئاوەکەی بخواتەوە، یان وەکو دەستەوانەوئەنگوستیلە لە پەنجە و لە دەستی بکات، یان بکرێتە بۆدرە و لێی بخوات، یان خۆی پێ بشێلێت، یان لە جێگەیەکی ناوماڵەکەی دایبنێت، هەموو ئامانەش ئاشکرایە وەکولە فەرموودەکاندا هاتووە بۆنموونە: (إنَّ الرقى والتَّمائم والتَّولة شرك)[1] یان (من علَّق تميمةً فقد أشرك)[2]هەمووئەو

[1] أخرجه ابن ماجه (٣٥٣٠)، وأحمد (٣٦١٥).

[2] صحيح الجامع:(٦٣٩٤).

ڕێگەچارانەی بە ناوی گەشـــە پێدانی مرۆییەوە لەم بارەوە دەكرێت جۆرێكە لە شەریك و هاوبەش بۆ الله بڕیاردان.

# یـــوگا

یەکێکی تر لەو باسـانەی پەیوەندیدارن بە باسـەکانی گەشـە پێدانی مرۆییەوە بابەتی یۆگایە، چونکە ئێمە پێشــتر ئاماژەمان بەوە کرد کە بابەتەکانی گەشـــەپێدانی مرۆیی خۆیان لە ســێ تەوەری سـەرەکیدا دەبیننەوە: فێرکردن و تەندرووستی و ئاستی دەرامەتی تاك، بۆیە لەو ڕوانگەوە یۆگاش لەســـەر بەشــی تەندرووستی گەشەپێدانی مرۆیی پۆلێن دەکەن.

لە ڕاســتیدا یۆگا ئەگەرچی وەکو شــێوەیەك لە وەرزش باس دەکرێت، بەڵام ڕاستی پرسەکە هەرگیزوا نییە و وێناکردنی یۆگا بەو شێوەیە خۆڵ لەچاوکردنە.

یۆگا لە بنچینەدا جۆرێکە لە عیبادەت کە لە دێر زەمانەوە لە هیندستان ناسراوە و پەرستشێکە بۆ خۆر ئەنجام دەدرێت، ناوی ڕەسـەنی ئەو عیبادەتە بریتییە لە (ساسـتانجا سوریا ناما سکار) واتە: (السجود للشمس بثمانية مواضع من الجسم) سەجدە بردن بۆهەتاو لە سەرهەشت ئەندام.

یۆگا بە دە شـــێواز ئەنجام دەدرێت، شـــێوازی پێنجەمی کە کەســـەکە درێژ دەبێتە ســـەرزەوی و هەردوو دەســـتی و لووتی وســـنگی و هەردوو ئەژنۆی وپەنجەکانی هەردوو پێی بەرزەوی دەکەون و بەو شیوەش لەسەرهەشت ئەندام کڕنووش بۆ خۆر دەبەن.

شێوازی یەکەمی ئەم وەرزشە بریتییە لە سڵاوکردن لە خۆرو پێویســـتە لەگەڵیدا هەندێ وشـــە ودەســـتەواژە بڵێت کە (مانترات)ی پێ دەوترێت، وەکو:

- (میترایا ناماه) واتە: ســـەرم بۆ دانەواندی ئەی هاوڕێی هەموان.

- (رافایر ناماه) واتە: ســـەرم بۆ دانەواندی کە تۆ هەموان سوپاس گوزارتن.

- (ســـوریا ناماه) واتە: ســـەرم بۆ دانەواندی ئەی ڕێ پیشاندەری هەموان.

- (ماریتشای ناماه) واتە: سەرم بۆ دانەواندی ئەی بەزێنەری دەرد و نەخۆشی.

- (سافتیر ناماه) واته: سەرم بۆ دانەواندی ئەی بەخشەری ژیان.

- (بها سکاریا ناماه) واته: سەرم بۆ دانەواندی ئەی سەرچاوەی ڕووناکی.

هەندێکیش ئەمەی بۆ زیاد دەکەن: (أوم هرام، أوم هريم، أوم هروم) واته: يا الله يا اللهم كه بێگومان مەبەستی لەو الله نییە لە ئیسلامدا باس دەکرێت.

مرۆڤ لە کاتی ئەنجامدانی وەرزشی یۆگا بەبێ ئەوەی بە خۆی بزانێت دەچێتە ناوهەندێ کەش و هەوای بتپەرستی و دەبێتە شوێنکەوتووی بێباوەڕان و گومڕایان، الله تعالى لە قورئاندا فەرموویەتی: (وان تطع أكثر من في الأرض يضلوك عن سبيل الله إن يتبعون إلا الظن وان هم إلا يخرصون ).

بەڵام هەندێ لە شارەزایان ئەگەرچی وتوویانە ئەگەرهیچ لەووشانەی پێویستە بوترێت لە یۆگا نەوترێت و شێوازو قۆناغەکانی پاش و پێش بکرێت و وەکو خۆی ئەنجام نەدرێت ئاساییە موسوڵمان ئەنجامی بدات، چونکە لەو حاڵەتەدا زیاتر

نییە لە هەندێ جوولەی وەرزشـــیی، بەڵام ئەوە بۆچوونێکی زۆر ناشـــەرعی و نـاپەســـەنـدە و لەگەڵ ڕەچـاوکردنی عەقیـدەو بیروبـاوەڕدا یەك نـاگـرێتەوە، بـۆیە لـێرەدا بە واجبی دزانـم هۆشـداری و ئامۆژگاری هەموو موسـوڵمانێکی بەرێزبکەم کە لە ژێر هیچ پاساوکدا یۆگا نەبێت و توخنی نەکەوێت.

یۆگا پەرستشـێکی هندۆسـییە و اتاکەی بریتییە لە یەکگرتن لەگەڵ پەروەردگاردا ! چونکە هندۆس باوەڕیان و ایە گەردوون هەمووی بە خۆر و مـانـگ و چیـاو دەریـاو هەموو بوونەوەرەوە ڕەنگـدانەوەیە و شـــوێنەوارێکە بۆ هێزیکی گەورە و بـوونێکی ڕاستەقینە کە بەخشەری هیزی وزەیە.

لە ڕاستیدا بڵاوبوونەوەی یۆگا لە وڵاتی موسـوڵمانانـدا وەکو أحمـد شـــەلەبی لە کتێبی " دیـانـات الهنـد الکبری " دەڵێـت: ڕێگەیەکی ناڕاســـتەوخۆیە بۆ دژایەتی کردنی ئیســـلام، چونکە ئیســـلام ئەو ئایینە بوو کە نەســـڕانییەت و بوزییەتی لەناو برد، بۆیە بڵاوکردنەوەی بیروبـاوەڕی پوچەڵ و دژ بە ئیســـلامی وەکو یۆگا دەستکەوتێکی گەورەیە بۆیان.

شـــێخ عثمـان الخميس دەڵێـت یۆگـا دینە و ڕێوڕەســـمێکی ئایینییە، بۆیە هەرکێ بانگەشـــە بۆ یۆگا بکات و خەڵکی بۆ بانگ بکات ئەوە بانگەوازی بۆ بێباوەڕی کردووە، دەڵێت ئەوکەسانەی کە ئەنجامی دەدەن ووەکو وەرزشێك ئەنجامی دەدەن بێ ئەوەی ئاگایان لەوە بیت کە یۆگا دینە لەوانەیە پێی کافر نەبن، بەڵام دەڵێت ئەوکەســەی حەقیقەتی یۆگا بزانێت و هەرســوور بیت لەسـەرکردنی ئەوەیە عیبادەتێکی لە دینی نەسـڕانی ویەهودیدا کردبیت جیاوازی نییە.[١]

[١] بڕوانە: https://youtu.be/FoMz١q٦a١lk.

## ڕاهێنەرانی گەشە پێدانی مرۆیی

ئێمە هەرلەسەرەتا ئاماژەمان بەوە کرد گەشە پێدانی مرۆیی زانستێکی ڕۆژئاوایی ئەمریکی پەتییە و سەرچاوە و ڕەگ و ڕیشەکانی ئەمریکییە و ڕۆژئاواییە بە گشتی، بۆیە بە هیچ شێوەیەك دامەزرێنەرانی پەیوەندییان بەسەرئایینی ئیسلامەوە نییە و بە شێوەیەکی گشتی باسە ئابووری و کارگێڕی و باسە گشتییەکانی نەبێت ئەوانی تری لە ئایینە ڕۆژهەڵاتییەکان و میتۆدە ئیلحادییەکانی ڕۆژئاوا وەرگیراوە و هەرئەوانیش پێشەنگ و پێشەوای ئەوزانستەن وڕاهێنەرانی زانستەکە پەیوەستن بەوکەسایەتی و بیرمەند وزانایانەوە.

بە پێی توێژەرێك بۆ ئەوەی ببێتە ڕاهێنەرێکی سەرکەوتوو، تەنها پێویستت بە چەند قاتێکی جوان و سەرنج ڕاکێشە، لەگەڵ کۆمەڵێك بڕوانامەی ڕیزکراووهاوارکردن وبەکارهێنانی زمانی جەستە، ئەوەشی دەمێنێت بیخەرە ئەستۆی ناونیشانی کۆڕەکە و ئەو خەرمانەی کە ڕێکخەرانی کۆڕەکە بۆتی درووست دەکەن.

زۆربەی ڕاهێنەرانی گەشەپێدانی مرۆیی لە پێناسەیەکی کورتدا خەیاڵ فرۆشن و هەمیشە جیهانێك لە وەهم و ئەفسانە بۆ بەشداربووانی خولەکانیان دروست دەکەن، بەردەوام وای دەردەخەن کە چارەسەری هەموو کێشەیەکی خێزانی و هەژاری و بێکارییان پێیە، لە جیهانی خەیاڵدا ئەوەت بۆ دەسەلمێنن هەموو شکست خواردنێك سەرکەوتنێکی بەدواوەیە و، هەموو شتێکت بوێت لەم ژیانەدا قابیلی جێبەجێکردن وبەرجەستەبوونە، تەنها قەناعەت بە خۆت بکە کە ئەو شتە جێبەجێ دەبێت، ئەگەر هەژاری چاو بنووقێنەو تەرکیز بکە و لەبەر خۆتەوە چەندین جار بڵێ: دەوڵەمەند دەبم دەولەمەند دەبم! ئیتر ئەوە سەرەتای دەوڵەمەند بوونی تۆیە، هەرهیوا و ئاواتێکی ترت هەیە هەمووی لەناو هۆڵی ڕاهێنەرەکەدا چارەسەرنەبێت لە پاش دەرچوونت دو اتر چارەسەردەبێت! تەنانەت ئەگەر بتەوێت تۆیش ببیتە ڕاهینەرێکی سەرکەوتوو، تەنها پێویستت بە بینینی چەند خولێك و چەند قاتێکی کەشخە وکۆمەڵێك بڕو انامەی ڕاستەقینەوساختە ئەبێت و هیچی تر،

لەگەڵ هەندێ قســـەی زل و زانیاری ســـەرنج ڕاکێش و دەنگ بەرزکردنەوە و گۆڕینی تۆنی دەنگ و بەکارهێنانی زمانی جەستە و درووست کردنی بەهارێکی پڕ لە گوڵ و وەنەوشە لە بیابانی دڵ و دەروونی ئەو داماوانەی لـە خۆڕایی پارەی خۆیان دەکەنە ناو دەسـتت و تۆیش تەنها بەخشـینەوەی ئومێد بە گۆترە وقسـەی خۆشت لەسەرە بیکەی بۆیان.

## ئەزمونی جاسون کونیل

“جاسون کونیل” لە وتارێکیدا بەناونیشانی: “لماذا فقدت إيماني بتوني روبينز؟” باسی ئەزموونی خۆی لەگەڵ گەشەپێدانی مرۆییدا دەکات و دەڵێت:

گەشە پێدانی مرۆیی لێوان لێوە لە خەڵەتاندنی دەروونی و عاتیفی لەسەرچەندین ئاست، لەنێوان بڕوانامە ساختەکانی ڕاهێنەران و ئەوکڵێشانەی کە لەبەری دەکەن هیچ شتێك بۆ ئەو خەڵکە زیاد ناکەن کە ئامادەی خولەکانیان دەبن، ئەوان بێ ئەوەی شیکاری بۆتواناکانت بکەن پێت دەڵێن ئارەزووت لەچی هەبێت توانای جێبەجێکردنیت هەیە، ئەمەش لەگەڵ توێژینەوەکانی دەروونناسیدا پێچەوانەیە کە ئەوان سەلماندوویانە ئەودەرچووانەی بە و اقیعی مامەڵە دەکەن هەلی کاروسەرکەوتنیان زۆرزیاترە لەوانە لە دەریای خەیاڵدا مەلە دەکەن.

## ئایا پابەند بوون بە ئیسلام لە گەشەپێدانی مرۆییدا دەپارێزرێت؟

ئەوانەی کە ئاراستەیەکی ئیسلامییان هەیە لە بواری گەشەپێدانی مرۆییدا، چی لە وڵاتانی دونیا و چی لە کوردستانی خۆماندا – لە سنوورێکی دیاریکراودا نەبێت – ئەستەمە بتوانن پابەندبوونی خۆیان بە دینەکەیانەوە بپارێزن، چونکە بنەما و بنچینەکانی ئەوزانستە بە گشتی ئیسلامی نییە و بەڵکو پێچەوانەی شەریعەت و عەقیدەی ئیسلامیشە، جگە لە هەبوونی کێشەیەکی تری گەورە کە ئەویش ئەوەیە ڕاهێنەرەکان زیاترلە جۆری ئیسلامییە مۆدێرنەکانن و بە هۆی نەشارەزایی زۆربەیان لە زانستی شەرعی و بابەتەکانی عەقیدە لەوە زیاتریان لێ چاوەڕوان ناکرێت، ئەوەی کە دەیزانن لە ئیسلام تەنها کۆمەڵە باسێکی ڕواڵەتییە.

## گەشە پێدانی مرۆیی لە کوردستان

ئەوانەی لە کوردستان خەریکی گەشەپێدانی مرۆیین، دوو جۆرن:

* جۆرێکیان پەیوەندییان بە ئیسلامەوە نییە، یان بە واتاییەکی وردتر پابەند نین بە ڕێنماییەکانی ئیسلامەوە و لە ڕوانگەیەکی عەلمانی پەتییەوە مامەڵە لەگەڵ بابەتەکە دەکەن وکێشەیان لە کارکردن لەسەرهیچ بەشێك لە بەشەکانی گەشەپێدانی مرۆیی نییە و هەموو میکانیزمەکانیشی بەلایانەوە پەسەندە، لە سایەی نەشارەزایی و جەهلی موسوڵمانان بە دینەکەیان ئەوان توانیویانە لە ژێر ناو و دروشمی جیاوازەوە هەنگاوی گەورە بهاوێشن، هەروەها لە دەرەنجامی دەرك نەکردنی مامۆستایانی ئایینی و حیزب و ڕێکخراوە ئیسلامییەکان بەو مەترسییە ئەوان چاوەڕوان دەکرێت لە داهاتوودا پێشڕەوی زۆرتریش بکەن .

* جۆری دووەمیان ئەوانەن کە پابەندن بە ئیسلامەوە، یان ئەگەر وردتر بین لە دەربڕیندا جۆرێکیان لە پابەند بوونی

ڕواڵەتی بە ئیسلامەوە هەیە، لەم بارەشەوە پێویستە چەند تێبینییەك تۆماربکەین:

١- زۆربەی ئەوانەی خەریکی ئەم بوارەن – نەك هەموویان – وابەستەبوونێکی کاڵیان بە ئیسلامەوە هەیە و پابەند بوونەکەیان زیاتر نییە لە خۆشەویستییەکی عاتیفی بۆ ئیسلام، یان پابەند بوون بە هەندێ لە ئاکارە ئیسلامییە گشتییەکانەوە، نەك موسوڵمانێکی مەنهەجیی خاوەن عەقیدەو مەنهەج و تەوحیدێکی باش بن.

هەروەها تێبینی ئەوە لە هەندێکیان دەکرێت کە بە کەسە گومڕاکان کاریگەرن چی لە مێژووی ڕابردووی ئیسلام، وەکو جەلالی ڕۆمی کە بەمەولانا دەناسرێت و حەلاج و ئیبنو عەرەبی و سوهرەوەردی وئینو سینا، لە هاوچەرخەکانیشدا کاریگەرن نەك تەنها بە عەدنان ابراهیم وطارق السویدان و کۆمەڵێك لەوانەی خویندنەوەی نامۆیان بۆ ئیسلام هەیە، بەڵکو بە غاندی و ئۆشۆ و ئەوجۆرە کەسانەش سەرسامن، بەم شێوەش

چاوەڕوانی ئەوەیان لێ ناکرێت زانستی گەشە پێدانی مرۆیی لەلای ئەوان بە فلتەری شەریعەتی ئیسلامدا تێپەڕێنن.

٢- زۆرێك لە ڕاهێنەرانی گەشەپێدانی مرۆیی وڕاهێنەرانی وزە لە کوردستاندا سەربە حیزبە ئیسلامییەکانن یان لەناو ڕێکخراوە ئیسلامییەکاندا کاردەکەن کە ئەوانیش یان زۆربەیان بەشێوەیەك لە شێوەکان سێبەرو پاشکۆی ئەوانن، یان ئەگەر کەسانی سەربەخۆو بێ لایەنیش بن، بەڵام لە ڕووی بیرکردنەوە وتیگەیشتن لە ئیسلام پێشی ئەوانیان لە نامۆیی و سەرپێچی شەرعیدا داوەتەوە، ئەوەش وای کردووە تێڕوانینیان بۆ ئیسلام هەمان تێڕوانینی ئەوان بێت وئاشکرایشە ئەوان بۆ خۆیان کەوتوونەتە ژێرفشارێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی وفیکری توندی هزری عەلمانیەتەوە و لە زۆرێك لە بابەتە جێگیرەکانی ئیسلامیش دابەزیون وگۆڕانکارییان کردووە، بەو پێیەش کە ئاماژەمان پێکرد ئەوان بە ڕێژەیەکی بەرچاو ئامانجیان بووەتە ڕازی کردنی شەقام و دڵی خەڵکیان پێ ناشکێت، بۆیە

لەبەرانبەردا ناچار سنوورەکانی دینەکەیان دەشکێنن و پەنا بۆ تەئویل و ڕاوبۆچوونی لاوازو سەیروسەمەرە دەبەن!

لەبەرئەم هۆکارە ڕاهێنەرەکان نەیانتوانیوە ئەو زانستە بە ڕەنگێکی ئیسلامی ڕاستەقینە ڕەنگ بکەن و پاکی بکەنەوە لەو هەموو دیاردەی لادان و شیرك و گومڕاییەی کە پێکهاتەیەکی ڕەسەنە لە پێکهاتەکانی گەشە پێدانی مرۆیی و جاری وا هەیە ئەوان و غەیری خۆیانت بۆ جیاناکرێتەوە، بەڵام ئەمە حوکمێکی گشتگیر نییە کە بلێی هەموویان بەو چەشنەن، واجبی دادگەری و ئینساف ئەوەیە بڵێین کە ئەوان کەسانی باش و تێگەیشتویان تێدایە کە زۆر لەوانە باشترن ئاماژەمان پێکردن بەڵام کەم و دەگمەنن.

٣- ڕاهێنەرانی گەشە پێدانی مرۆیی لەوانەی کە وابەستەبوونێکیان بە ئیسلامەوە هەیە زۆربەیان کە من بە خۆم ژمارەکیان دەناسم شارەزایی شەرعی پێویستیان لە کتاب و سوننەت وزانستە شەرعییەکان و بەتایبەتیش لە تەوحید و عەقیدەی ئیسلامی بە گشتی زۆرلاوازە  و نە لەسەرئەوەش

پەروەدرە بوونە وەکو مەنهەجێکی زانستی، بەڵکو لە ناو حیزب وڕیکخراوەکانیاندا بە زۆری کۆمەڵە بابەتێکی ڕێکخستن و کارگێڕی و تەماشا کردنی ئیسلام لە دیدێکی سیاسی پەتی زاڵە بەسەریاندا و بەو شێوە فێرکراون.

ئەوان لە بنچینەوە کێشەیەك لەو گومڕایی و لادانانەی گەشە پێدانی مرۆیی نابینن تاکو خۆیانی لێی بپارێزن، چجای کەسی تری لێ وریا بکەنەوە، دواجار وەکو دەرەنجامێکی چاوەڕوان کراو، نەیانتوانیوە خۆیان لە خراپییەکانی ئەو زانستە ڕزگاربکەن و نە موسوڵمانی کوردیشی لێ وریابکەنەوە، وەکو لە عەرەبیدا دەوترێت (فاقد الشیء لا یعطیه) بۆیە بەداخەوە دەبینیت ئامانجی گەورەی زۆرێك لەوان بووەتە گەشتی دەرەوەو بەشداری کردن لە خولی نێو دەوڵەتی و کۆکردنەوەی پارە و ناوبانگ دەرکرن لەسەر حیسابی ئەوانەی کە کڕیاری کاڵا خەیاڵییەکانی ئەوانن.

٤- لە ڕووی ویژدان و ئینسافیشەوە بە پێویستی دەزانم بڵێم: ئەوڕاهێنەرانە لە کوردستاندا کەسانێکیان تێدایە – من بە

خۆم هەندێکیان دەناسم – تا بتوانن پەرۆشن ئەوزانستە بۆ خزمەتی دینەکەیان و موسوڵمانان بەکاربهێنن و لەهەموو شتێك بۆیان ساغ بێتەوە لەگەڵ ئیسلامدا ناگونجێت خۆیان بە دوور دەگرن وملکەچی شەرعن، بەڵام مەخابن ئەوکەسانە بەراورد بە کۆی ڕاهێنەران کەمینەن.

## حوکمی کارکردن لە بواری گەشەپێدانی مرۆیی

سەبارەت بە حوکمی کارکردن لە بواری گەشە پێدانی مرۆییدا ئەو مەسەلە پەیوەستە بە جۆری ئەو بابەتانەی کە ڕاهێنەر پێیانەوە خەریکە:

– ئەگەربابەتەکان بریتی بێت لەوبوارانەی لەگەڵ ئیسلامدا بە هیچ شێوەیەك تێکناگیرێت و پێچەوانەی دەقەکانی قورئان وسوننەت نییە، وەکو: پلاندانان بۆژیان و دیاری کردنی ئامانجی باش و ڕێکخستنی کات و پەروەردەی مناڵ وهونەری پەیوەندییە خێزانییەکان و هونەری پەیوەندی کردن و گفتوگۆو شێوازی وتاردان و قسەکردن و بە هیزکردنی کەسایەتی بۆ ئەوەی خەڵەتاندنی خەڵك و فرۆشتنی بابەتی خەیاڵاوی تێدا بێت و بە مەرجێك ئەو کەسە هەوڵ بدات ئەوزانستە لە خزمەتی دینەکەیدا بە شێوەیەك لە شێوەکان بەکاربهێنێت، ئەوە کارێکی درووستە و هەوڵێکی باشە و هیچ گرفتێك لە ئەنجامدانیدا نیە والله اعلم.

بەڵام بە قەناعەتی کەسێتی خۆم کۆنترۆڵ کردنی ئەم زانستە بەو شێوەی باسمان کرد بۆ موسوڵمان زۆر ئەستەمە ئەگەر بێت و ڕاهێنەر زانستی شەرعی و هەستکردنی بە لێپرسراوێتی بەرانبەر

دینەکەی نەبێت بتوانێت بەسەلامەتی لێی دەرباز بێت و بێ تاوانباربوون لێی دەربچێت، چونکە ڕێك وەکو کەسێك وایە کار لەسەر کۆمەڵە بابەتێك بکات هەندێکی بەسوودە و هەندێکی زیان بەخشە و تیکەڵ بەیەکتربوونە و جیاکردنەوەیان لەیەك کاتدا وریایی زۆری دەوێت.

دیوەکەی تری ئەم زانستە کە بەتەواوی لەگەڵ بیروباوەڕی ئیسلامدا تێکدەگیرێت و لەڕاستیدا جاری واهەیە بابەتێکی سەربەخۆی گەشە پێدانی مرۆییەو جاری واش هەیە تێکەڵە بە باسە باشەکانی و لەیەك کاتدا دەخرێنە ڕوو، وەکو بابەتەکانی چارەسەرکردن بە وزەی گەردوونی و یۆگا و هەندێ لەو باسانەی بۆ نموونە ئاماژەمان پێکرد؛ هەموو ئەوانە لە ڕووی شەرعەوە حەرام وقەدەغەکراون ن و هەر موسوڵمانێك بە درووستی لە

دینەکەی تێگەشتبێت، هەرگیز نزیکی ئەو جۆرە بابەتانە ناکەوێتەوە، چونکە جۆرێکە لە ڕوخاندنی بیروباوەڕی ئیسلام و هاوکات پەرەپێدانیشە بە بیروباوەڕی شیرك وبتپەرستی و فەلسەفە گومڕاکانی ڕۆژهەڵات و میتۆدە ئیلحادییەکانی ڕۆژئاوا.

پرسیار لە دکتۆر (وهبة الزحيلي) کرا ئایا درووستە موسوڵمان فێری زانستەکانی میتافیزیقیا بێت وەکو: التواصل عن بُعد - ، " قراءة الأفكار" telepahtic ، " الخروج الأثيري عن الجسد " out of body experience ، " تحريك الأشياء بالنظر النظر المغناطيسي " ، " اليوجا ، و " التنويم الإيحائي " ، " التاي شي " ، " الريكي " ، " التشي كونغ " ، " المايكروبيوتك " ، " الشكرات " ، " الطاقة الكونية " ، " مسارات الطاقة " ، " الين واليانغ " ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی: (هذه وسائل وهمية ، وإن ترتب عليها أحياناً بعض النتائج الصحيحة ، ويحرم الاعتماد عليها وممارستها ، سواء بالخيال ، أو الفعل ، فإن مصدر العلم الغيبي : هو الله وحده ، ومن اعتمد على هذه

الشعوذات : كفر بالله ، وبالوحي ، كما ثبت في صحاح الأحاديث النبوية الواردة في العَّراف ، والكاهن ، ونحوهما) .و اته: ئەم هۆكارانە خەیاڵین وئەگەرچی هەندێك جار دەرەنجامی ڕاستیشی لێ بكەوێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو هۆكارانە بە خەیال بێت یان بە كرداربێت ، حەڕامە ئەنجام بدرێن و پشتیان پێ ببەسترێت، چونكە سەرچاوەی زانستی غەیب و نادیارتەنها الله یە، هەركەسێكیش باوەڕی بەو هۆكارانە هەبێت وكاری پێ بكات ئەوە بێ باوەری خۆی ڕاگەیاندووە بە الله و بە وەحی، وەكو لە فەرمودە سەحیحەكاندا دەربارەی فالچی وجادوگەرو نوقڵانەلێدەرهاتووە.

## حوكمی خویندنەوەی كتێبەكانی گەشە پێدانی مرۆیی

سەبارەت بە خوێندنەوەی كتێبەكانی گەشەپێدانی مرۆیی (التنمية البشرية)، لەبەرئەوەی تیكەڵەیەكە لە زانیاری چاك و خراپ و بابەتەكان ئاویتەیەكن لە حەڵاڵ و حەرام و بابەتی گونجاو لەگەڵ ئیسلام و هاوكات وەرگیراو لە ڕێبازە گومڕاكانی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات، بۆیە تەنها بۆ كەسێك درووستە بیخوێنێتەوە توانای لێكجیاكردنەوەی ئەو بابەتە دژەیەكترانەی هەبێت و مەترسی ئەوەی لەسەرنەبێت تووشی سەرسام بوون بێت بەو بیرۆكانەی دژبە ئیسلامن.

شایانی باسیشە لەم ساڵانەی دواییدا كۆمەڵێك كتێب نوسراون لە بواری گەشە پێدانی مرۆییدا هەوڵێك بووە بۆ ئەوەی جەخت لەسەربەشە باشەكانی ئەوبوارە بكرێتەوە و سوودی لێ وەربگیرێت، وەكو:

- "مدخل إلى التنمية المتكاملة" د. عبد الكريم بكار.
- " الإسلام والتنمية الاجتماعية " د. محسن عبد الحميد .
- " فلسفة التنمية رؤية إسلامية " إبراهيم أحمد عمر.

- " التنمية البشرية في السنة النبوية ". سماح الغندور.
- " المنظور الإسلامي للتنمية البشرية " أسامة العاني .

## پوختەی تێکگیرانی گەشەپێدانی مرۆیی لەگەڵ عەقیدەو بیروباوەڕی ئیسلامیدا

قسەمان لەسەرئەوە نییە – وەکو پێشتریش ئاماژەمان بۆ کرد – کە زانستی گەشەپێدانی مرۆیی کۆمەڵە بابەتێکی هاوتەریب وگونجاوی لەگەڵ شەریعەتدا هەیە، بەڵام گرفتی هەرە گەورەی گەشە پێدانی مرۆیی لەو پرسانەدایە کە لەگەڵ تەوحید وبیروباوەڕی ئیسلامدا بە گشتی تێکدەگیرێت، لە چەند خاڵێکدا بەشێك لەو تێکگیرانانە دەخەینەڕوو:

یەکەم: زانستەکانی گەشەپێدانی مرۆیی پشتی بەستووە بە تێڕوانین و دیدێکی مادی پەتی بۆژیان و لەمەسەلەی قەدەردا بەڕوون و ئاشکرا لە ئیسلام جیا دەبێتەوە و دوور دەکەوێتەوە.

دووەم: لە زانستەکانی گەشەپێدانی مرۆییدا توانایەکی حەتمی بە مرۆڤ دراوە بۆ بەدەستهێنانی سەرکەوتن، بەبێ ئەوەی هیچ حیسابێك بۆ پەروەردگار و بۆ قەدەر بکرێت. بە شێویەکی گشتی ڕاهینەران لە خولەکانیاندا بۆبەشداربوان زیاتر جەخت لەسەر تواناکانی بەشداربوو دەکەن و هەموو

شــتێك نابەســتنەوە بە ویســت و ئیرادەی الله و نە ئاماژەش بۆ ئەوە دەکەن کە لە ژیانی ئەم دونیایەدا هەموو شتێك بەقەدەری خۆی ڕێ دەکات کە پەروەردگار بۆی دیاری کردووە: (إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَٰهُ بِقَدَرٍ)القمر: ٤٩.

سێیەم: لە گەشە پێدانی مرۆییدا کار بە یاسای بەکێشکردن (قانون الجذب) دەکرێت! و اتە ئەوەی مرۆڤ بیری لێ دەکاتەوە گەردوون بۆی ئەنجام دەدات! پوختەی ئەم یاســایە ئەوەیە ئاســتی بە هێزبوونی بیرکردنەوەی مرۆڤەکان تایبەتمەندییەکی زۆری هەیە، چەند بیرلە شــتی خراپ بکەیتەوە شــتی خراپت بەسەردا دێت و چەند بیرلە شتی باش و خەونی باش بکەیتەوە دەستت دەکەوێت وپێی دەگەیت!

یاســای بەکێشــکردن ئەوەیە کەســەکە هەســت بە هێزە بێ ســـنوورەکەی خۆی بکات و و ابزانێت گەردوون ملکەچە بۆ بیرۆکەکانی، ئینجا بیر لە خەون و ئامانجەکانی بکاتەوە لەو کاتەشــدا بیرو هزری مرۆڤەکە شــەپۆل دەنێرێت و دەســتی

دەخات و پێی شادمان دەبێت و ئەگەرشکسنی هێنا هەوڵەکە دوبارە دەکاتەوە!

چوارەم:مەسەلەی وزە (الطاقة) کە بڕبڕەی پشتی گەشەپێدانی مرۆییە، لە بنچینە دا پەرستشێکی بوزاییە تێکەڵ بووە بەهەندێ چەمکی هیندۆسی، لەبنەما سەرەکییەکانیشی ئەوەیە مرۆڤ توانای چارەسە کردنی خۆی هەیە بەبێ هیچ هێزێکی دەرەکی.

پرسی وزە لەوزانستەدا زۆر پرسێکی مەترسیدارە، ئەوان بە زمانی حاڵ و گوفتاریش دەڵێن (طاقة) هەموو شتێکە لە گەردووندا، هۆکاری خۆشحاڵی و بەدبەختییە، سوود و زیان هەر لای ئەو وزەیە و بە شێوەیەکی نا راستەوخۆ کە دەرك پێکردنی هیچ گران نییە، ڕاهێنران و سەرانی گەشەپێدانی مرۆیی مافەکانی پەروەردگاریان بەو وزەیە سپاردووە.

ئینجا ئەووزەی کە ڕاهینەران لە گەشەپێدانی مرۆییدا باسی دەکەن، هیچ پەیوەندییەکی بەو وزە فیزیاییە نییە کە لە گەردووندا هەیە، نەمەبەستیش لێی وزەی نەوەوی و وزەی بایە،

بەڵکو باسی وزەیەکی جیاواز دەکەن لە گەردووندا بوونی هەیە و بە (کی) ناوی دەبەن کە شیفاو چاکبوونەوە و ئارامی و بەختەوری بە دەستی ئەوە، ئەم چەمکەش لە ڕاستیدا لە هەندێ بیروباوەڕی شیرکی ڕۆژهەڵاتەوە وەرگیراوە و هەمان ئەو بیرۆکەیە کە فەیلەسوفەکان بانگەشەیان بۆ دەکرد سەبارەت بە (العقل الكلي و الوعي الكلي).

بە کورتی ئەووزەی کە باسی دەکەن لە ڕوانگەی عەقیدەو بیروباوەڕی ئیسلامیدا تاغوتێکە و دەپرسرێت.

پێنجەم: کاتێك لەو هەڵانەی گەشەپێدانی مرۆیی ورد دەبیتەوە دەبینیت بە هەمان ئەم شێوەی کە ڕاهێنەران باسی دەکەن، یان نزیك لەوە، لە هەندێك ئایینی دەستکردی وەکو هندۆسی و بوزیشدا هەیە.

شەشەم: الله تعالی بەم ئیسلامە موسوڵمانی بێ نیازکردووە لەوەی پەنا بۆ ئەوکەش و هەوا و ڕێورەسمە شیرکییانە ببات و لێیشی قەدەغە کردوە پەنایان بۆ ببات، پێغەمبەرێکسشی بۆ ڕەوانە کردووین بۆ ئەوەی ئەگەر بمانەویت ڕێگای ڕزگاری

هەڵبژێرین شوێنی بکەوین و ئیسلام بکەینە جێگرەوەی ئەو ڕێباز وڕێچکە پڕلە گومڕاییانە.

# کـــۆتایی

لـە کۆتـاییـدا دەڵێم: زانســتی گـەشـــە پێـدانی مرۆیی، زانســتێکی ڕۆژئاوایی پەتییە، بەڵام ڕەگ و ڕیشـــەکانی ڕۆژهەڵاتییە و پەیوەندی بە ئایینە دەستکردەکانی ڕۆژهەڵاتەوە هەیە.

گەشە پێدانی مرۆیی دەبێتە دوو بەشەوە: بەشێکی بریتیە لە کۆمەڵە زانسـت وزانیاری ومیکانیزمێکی بە سـوود و وەکو هەرزانسـتێکی باش و بـە ســـوودی تر دەکرێت ببێتـە جێگای بـایـەخ و خەڵکی ســـوودی لێ وەربگرن.

بەشـــێکی تری هەیە هەڵقوڵای ئایینە دەســـتکرد و بتپەرســـتییەکانی ڕۆژهـەڵات و میتۆدە ئیلحـاییـەکانی ڕۆژئـاواییـە تیکـەڵ بـە هـەنـدێ بوار کراوە کـە خـەڵکی پێویســـتی زۆریـان پێیـەتی، وەکو چـارەســـەر کردنی نەخۆشی ودایت و کێشـەی دەروونی و بابەتی هاوشێوەی تر.

بە ڕاشـــکاویش هەموو کەســـێك ناتوانێت حەقیقەتی جیاوازی و ناکۆکی ئەو بوارانە لەگەڵ ئیســـلامدا بزانێت و لەلای خۆمان هەوڵ دەدرێت پۆشـــاکێکی ئـایینی بـەبـەری ئـەو بـەشـــە نـاکۆکـەی لـە گـەڵ بیروبـاوەری ئیســـلامـدا بکرێـت بۆ ئـەوەی خـەڵکی وەریگرن و ســـوودی مادیئەو کەسانەش دەستەبەرو بەردەوام بێت.

گەشــە پێدانی مرۆیی لە بنچینەدا زانســتێکە باشــەکەی باشــە و خراپەکەشــی زۆر خراپە، بەڵام لەبەرئەوەی باش و خراپی تێکەڵ بە یەکترکراوە و زۆرجار لـە ســـەریـەك ســـفرە هـەمووی پێکـەوە وەکو هەنگوین و ژەهر پێکەوە دەرخواردی بەشداربووانی خول و کۆرسەکانی گەشە پێدانی مرۆیی دەدرێن، وەکو ڕێژەش خراپییەکانی لە باشییەکانی بێگومـان زیـاترن بەڵکو زۆریش زیـاترن، بۆیە موســـوڵمـان لەهەمووی خۆی بپارێزێت و بەدیلی ئیسلامی بۆ بدۆزێتەوە باشترە.

## سەرچاوە

بۆ نووسینی ئەم بابەتە سوودم لە کۆمەڵێك سەرچاوە و بەرهەمی جیاوازبینی، لەوانە:

– فلسفة الطاقة وثنية قديمة في ثوب قشيب/ فيصل بن علي الكاملي.

– التنمية البشرية والبرمجة العصبية من منظور شرعي/ محمود عبد الرازق. الرضواني.

– الماكروبايوتكس في ميزان الشريعة/ محمد صالح المنجد.

– التنمية البشرية.. طريقك السريع للفشل!/ سامح عودة.

- البرمجة اللغوية العصبية والتنمية البشرية/ سارة بنت محمد.

-معتقدات علوم التنمية البشرية والبرمجة اللغوية والعصبية من منظور العقيدة الاسلامية...

- الحقيقة الشرعية للبرمجة اللغوية العصبية وغيرها من الوافدات/سامي وديع عبد الفتاح القدومي.

– سايتی دكتورة فوزبنت عبد اللطيف كردي.

– سایتی الاسلام سؤال وجواب.

_ سایتی طریق الإسلام و الإسلام الیوم.

- هەندێك ســـەرچاوەی تریش كە لە پەراوێزەكاندا ئاماژەیان بۆكراوە.

# ناوەڕۆک